



# فیقهی پاکژی ئافرەتان لەدیدی کۆڕای زانایان

ئامادەکردنی
عبدالله مروان لەك

# فیقهی پاکژی ئافرەتان

# لە

# دیدی کۆڕای زانایان

ئامادەکردنی:

عبد الله مروان لەک

# ناسنامەی نامیلکە

ناوی نامیلکە:فیقهی پاکژی ئافرەتان لە دیدی کۆڕای زانایان

دانەری نامیلکە:عبداللە مروان لەک

ساڵی دانانی:٢٠٢٣ز – ١٤٤٤هـ

# بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الحَمْدُ للّٰهِ وَكَفَىٰ، والصَّلاةُ والسَّلامُ عَلَىٰ عِبَادِهِ الذِيْنَ أَصْطَفَىٰ، لا سِيَمَا عَبْدِهِ المُصْطَفَىٰ، وآلِهِ المُسْتَكْمِلِيْنَ الشَّرَفَا.

**أَمَّا بَعْدُ:**

خوێندن و زانست پیشەی خاوەن ژیری و ووره بەرزەکانە، بە تایبەت خوێندنەوە لەبەر پێویستی ڕۆژانە و مانگانە و ساڵانە کە بەردەوام لە دووبارە بوونەوەدان، پێویستە تاکی موسوڵمان شارەزی بێت، چونکە ئەو زانستەی کە پەیوەستە بەتاکی موسوڵمانەوە ئەنجامی بدات و شارەزای بێت دەچێتە چوارچێوەی **"فەرزی عەینەوە"** گەر خاوەنەکەی شارەزای نەبێت و بەبێ زانستی ئەنجامی بدات پێی **"تاوانبار"** دەبێت، ئەوەش سەلمێنراوە لە ڕوانگەی ژیری و دەقەوە.

لە ڕاستییدا ئەگەر بە ووردی بیر بکەینەوە بۆمان دەردەکەوێت: پێویستی هەر تاکێکمان بە زانست لە پێویستیمان بە نان و ئاو زۆرترە! وەکو پێشەوا أحمد رَحِمَهُ ٱللَّهُ فەرموویەتی: مرۆڤ ڕۆژی چەند جارێك پێویستی بە نان و ئاوە، بەڵام لە هەموو کاتێکدا پێویستی بە زانستە. بەتایبەتی زانستی شەرعی. چونکە مەشخەڵ و بەرچاو ڕوونی دونیا و سەرفرازی و ڕزگاربوونی دواڕۆژە.

بەنـدەش لێرەدا هەڵسـاوە بە ئـامـادەكردنی ئەم نـامیلكەیە لە بـارەی **(فیقهی پاكژی ئافرەتان)**، لە دیدی كۆڕای زانایان" كە ناوەڕۆكی كتێبەكە لە چوارچێوەی **"ســووڕی مـانگـانە و خوێنی منـداڵ بوون و خوێن چڕكە"** دا دەخولێتەوە.

چۆنیەتی مامەڵەكانی بەندە لەگەڵ دەقە شــەرعییەكان: لەلای زانایان و فێرخوازانی زانســت ڕوونە كە باســی خوێنی ئافرەتان دەقی كەمی لە قورئان و فەرموودەدا هاتووە، بۆیە باسێكە جێگای مشت و مڕی زانایان بووە لە كۆن و نوێدا، قورئان وەكو ســیفات و ووتەی خوای پەروەردگار لە هەر باســێكدا شتێكی باس كردووە، ئەوەی تری لە ڕێگای پێغەمبەری خواوە ﷺ ڕوونكردۆتەوە، بەڵام كـاتێـك لە گوڵزاری فەرموودەكانی خۆشــەویســت ﷺ ئەڕوانین ئەوەمـان بەرچـاو نـاكەوێـت كە تێنوویەتی زانســتی ئێمەی پێ بشــكێ وەكو بـاســەكانی "نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەكات و هتد..." فەرموودەی لەبارەوە نەهاتــووە، تەنـــها چەنـــد فەرموودەیەك نەبێت، هۆكارەكەشی ئەوەیە وەكو زانایان باسیان كردوە: سروشتی ئافرەت بووە كە شەرم بكات لەم باسەدا زۆر پرسیار بكات.

هەوڵمداوە زیاتر باســەكان بە كورتی كۆتایی پێ بهێنم، چونكە ئەو باســە وەكو هەر باسێكی تری فیقهی ئاوی زۆر هەڵدەگرێ بەڵكو زیاتریش لە باسەكانی

تر، بۆیە زیاتر بەلای کۆ دەنگی زانایان چوومە، پاشان هەڵبژاردەی پێشەوا ابن تیمیە رَحِمَهُ اللَّهُ گرنگیم پێداوە، ڕەحمەتی خوای پەروەردگار لە تێکڕای زانایان و مامۆستایانمان بێت.

**وصلى الله وسلم وبارك على عبده ورسوله نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين.**

پێنج شەممەی ١٤٤٤/٨/٢٣ کۆچی

بەرامبەر ٢٠٢٣/٣/١٠ زاینی - پایتەخت

**عبدالله مروان لەك**

# سووری مانگانە

**سـووری مانگانە:** لە **زمانەوانیدا** بە واتای السَّـیلانُ دێت. واتە: لەبەر ڕۆیشتن.[١]

**لە شـەرعزانیدا:** خوێنێکی سرووشـتی شـلە لە منداڵدان دەردەچێت لە دامێنی ئافرەتی پێگەیشتوو، تووشی دەبێ لە ڕۆژانێکی دیاریکراو .[٢]

**سـیفاتی خوێنی حەیز:** خوێنێکی ڕەشی خەسـتە، بۆنی ناخۆشـە، هەرگیز نامەیی، نابەستریٚ گەر بۆ ماوەیەکی درێژ بمێنێتەوە، لە ئەنجامی نەخۆشی یان منداڵ بوونەوە نییە، گەرمە، بە ئازارە، هەنێ لە ئافرەتان تووشـی هەڵچوونی زۆر دەکات.[٣]

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: (هذا شيء كتبه الله بنات آدم).[٤]

---

١- (لسان العرب) لابن منظور (١٤٣/٧).

٢- (مغني المحتاج) للشربيني (١٠٨/١)

٣- ( شرح العمدة ) لابن تيمية (٤٩٩/١).

٤- البخاري: ٢٤٩. مسلم: ١٢١١.

واتە: ئەمە شـــتێکە خـوای گەورە لەســـەر کچەکانی نەوەی ئـادەم نووسیویەتی.

**مـاوەی حەیـز**: جـێـگـای ڕا و بـۆچـوونـی زانـایـانە، بە گـوێـرەی ئەو فەرمووودانەی هەن لەســـەر ئەم بـابەتە مـاوەی دیـاریکراوی بۆ نییە؛ شـــێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە رَحِمَهُ اللَّهُ دەفەرمووێ: **(وأمَّا الذين يقولون : أكثر الحيض خمســـة عشـــر كما يقوله الشـــافعيُّ وأحمد ، ويقولون : أقلُّه يومٌ كما يقوله الشـــافعيُّ وأحمد ، أو لا حدَّ له كما يقوله مالكٌ، فهُم يقولون : لم يثبت عن النبيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ولا عن أصحابه في هذا شيءٌ ، والمرجع في ذلك إلى العادة كما قلنا)**.[٥]

واتە : ئەوانەی دەفەرموون زۆرینەی ماوەی حەیز پازدە ڕۆژە کەمییەکەی یەك ڕۆژە وەکو امـام شـــافعی و امـام احمـد رَحِمَهُمَا اللَّهُ دەفەرموون ، یـان ئەوانەی دەڵێن: ماوەی دیاریکراوی نییە وەك امام مالك رَحِمَهُ اللَّهُ ، هەموویان دەڵێن: ســەلمێنراومان لە پێغەمبەری خواوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێ نەگەیشـتووە ، بۆیە پێویســـتە ڕەچاوی عادەت و داب و نەریتی کۆمەڵگاکەی بکات هەروەك ووتمان ماوەی دیاریکراوی نییە.

---

٥- (الفتاوی الکبری) (١/ ٤١٩) و (مجموع الفتاوی) (٢١/ ٦٢٣) کلاهما لابن تيمية.

## كاتەكانی هاتن و كۆتایی سووڕی مانگانە:

لە دایكمان عائیشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەگێڕنەوە فەرموویەتی: فاتیمەی كچی ئەبی حەبیش خوێنێ دەبینی دوای سووڕی مانگانە منیش پرسیارم كرد لە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: (ذلك عرق وليست بالحيضة ، فإذا أقبلت الحيضة فدعي الصلاة ، وإذا أدبرت فاغتسلي وصلي).[٦]

واتە: ئەو شلەیە خوێن نییە هەركات خوێنی سووڕی مانگانەی بینی با نوێژەكانی نەكات، گەر كاتی سووڕی مانگانەی بەسەرچوو، خۆی بشوات و نوێژەكانی بكات.

**ڕوونكردنەوەیەك:** كەواتە پێش سووڕی مانگانە ئافرەت شلەیەك دەبینێ.

**سووڕی مانگانە چۆن دەست پێدەكات، نیشانەی كۆتایی پێهاتنی كەیە، ئەمەش دوو نیشانەی هەیە:**

١- ووشك بوونەی منداڵدان: واتا ووشك بوونەوەی شوێنی منداڵدانی ئافرەت، ئەمەش بە كلێنست یان پارچە قوماشێ تاقیدەكرێتەوە، بەڵام بۆ تەندروستی باشترە كلێنس بێ.

---

٦- البخاري: ٣٢٠.

**٢-** هاتنی ئاوی سـپی : ئەمەش بەهەمان شـێوە لە شـوێنی منداڵدانی ئافرەتەوە ئاوێکی سپی بەدی دەکرێ لە ڕێگای کلێنس یان پارچە قوماشێکەوە تاقیدەکرێتەوە.

دوای پـاك بوونەوە لە سـووڕی مـانگـانە ئـاوێکی زەردبـاوی لێـڵ بەدی دەکرێ: کە ئـافرەت ئەمەی بینی گرنگی پێنـادات لەبەر ئەوەی تەنها پیسـی و جەراعـاتی برینن؛ وەك ئوم عەتیە رَضِيَ اللهُ عَنْهَا دەگێڕێتەوە: (کنَّـا لا نعـدُّ الکـدرة والصفرة بعد الطهرِ شيئا).[٧]

واتە: هیچ حسـێبێکمان بۆ ئەو ئاوە زەردباوە لێڵەی دوای پاك بوونەوە نەدەکرد پاشان کارەکانی خۆی وەك: نوێژ و ڕۆژوو و سەر جێی خۆی دەکات.

**پـرسـیـار/** حوکمی ئاوی قاوەیی دوو ڕۆژ زیاتر یان کەمتر لە پێش سووڕی مانگانە و دوای سووڕی مانگانە چییە؟.

**وەڵام/** ئەم ئاوە قاوەییە ئازاری لەگەڵدایە وەك سووڕی مانگانە، گەر لە پێش سووڕی مانگانەوە بێت ئەوە هەر بە حەیز دادەنرێ وە گەر دوای سووری مانگانەوە بێت ئەوە هەر بە سـووڕی مانگانە دادەنرێ، چاوەڕێ دەکرێ تاوەکو پاك دەبێتەوە.

---

٧- ابو داود: ٣٠٧

دایكی ئیمانداران عائیشــه رَضِيَ اللهُ عَنْهَا دەفەرمووێ : ( لاَ تَعْجَلْنَ حَتَّى تَرَيْنَ القَصَّةَ البَيْضَاءَ ).[8]

واته : پەله مەكەن تاوەكو ئاوی سپی دەبینن.

**چەند ڕوونكردنەوەیەك:-**

شــێخی ئیســلام ئیمـام ئیبن تەیمییه رَحِمَهُ اللهُ دەفەرمووێ : **(ئەگەر ئافرەت له ســووڕی مانگانه پاك بوویەوە ئاوی دەســت نەدەكەوت خۆی بشــۆرێت تەیەمووم دەكات)** جا نوێژ و ڕۆژوو و ســەرجێی خۆی دەســت پێدەكاتەوە ( ئەمه ڕای زۆرینەی شەرع ناسانه وەك مالك و احمد و شافعی).[9]

ئەگەر خوێن له عادەتی ئاسایی خۆی زیاتر بوو : بۆ نموونه مانگی شەش ڕۆژ دەكەوێته ســووڕی مانگانەوە بەڵام ئەمجاره بوو به حەوت یان هەشــت ڕۆژ، ئەم ئافرەته به دوو حاڵەت بەدەر نییه.

**یــەكــەم:-** خۆی خوێنی حەیز دەناسێ بەم سیفاتانەی باسمان كرد له خوێنی تری جیا دەكاتەوە، گەر سیفاتەكانی وەك سووڕی مانگانه بوو، ئەوە به ســووڕی مانگانه هەژماری دەكات و نوێژ و ڕۆژوو و ســەرجێی ناكات، گەر سیفاتەكانی سیفاتی خوێنی سووڕی مانگانه نەبوو، ئەوە خۆی دەشۆرێ و نوێژ و ڕۆژوو سەرجێی دەكات.

---

[8]- ذكره البخاري معلقاً بصيغة الجزم في " صحيحه " ، " فتح الباري " (٤٢٠/١).

[9]- مجموع الفتاوى : ٦٢٥/٢١.

**دووەم:-** خۆی سیفات و خوێنی سوورِی مانگانە نازانێ لە خوێنی تری جیا ناکاتەوە.

زۆر ئافرەت هەیە بە تایبەت لە گەنجەکاندا، ئەم ئافرەتە لەم حاڵەتەدا نوێژ و ڕۆژوو و سەرجێی ناکات تا پاك دەبێتەوە.

گەر خوێنی سوورِی مانگانە دوو ڕۆژ هات و ڕۆژێك وەستا، پاشان دوایی دوو ڕۆژی تر هاتەوە وە ئەو ڕۆژانەی دەکەونە نێوانی ڕۆژانی سوورِی مانگانەوە هەر بە سوورِی مانگانە هەژمار دەکرێ، ئافرەت گەرچی لە خوێن پاك بێت، بەڵام نابێ نوێژ و ڕۆژوو و سەرجێی بکات ، تاوەکو ئاوە سپییەکە دەبینێ.[١٠]

**پرسیار/** ئایا ئافرەتی دوو گیان دەکەوێتە سوورِی مانگانەوە؟.

**وەڵام/** زۆربەی شەرع ناسان فەرموویانە : ئافرەتی دووگیان ناکەوێتە سوورِی مانگانەوە.

بەڵگەکەیان فەرموودەکەی ئەبو سەعیدی خودرییە رضي الله عنه کە فەرمووی: ( لا توطأ حامل حتى تضع ولا غير حامل حتى تحيض حيضة ).[١١]

واتە : ئافرەت مارە ناکرێ تا حەملەکەی دادەنێ، غەیری ئافرەتی دووگیانیش دوای ئەوەی جارێك دەکەوێتە سوورِی مانگانەوە.

---

١٠- ( ابن العثيمين )لفتاوى المرأة (ص : ٢٦).

١١- ابو داود : ٢١٥٧ . احمد : (٦٢/٣).

شــەرع نـاســـان فەرموویـانە : دانـانی حەملەکە بۆتە نیشـــانەی پاك بوونەوەی منـداڵـدانی ئـافرەتەکە، کەوابـوو ئـافرەتی دووگیـان نـاکەوێتە حەیزەوە، بەڵام گەر شــتێکی ئاوا ڕوویدا ئافرەتەکە زانی ئەمە خوێنی ســووڕی مانگانەیە سیفاتەکانی هاتۆتە جێ، بێگومان دەبێ وازلە نوێژ و ڕۆژوو و سەرجێی بێنێت تا پاك دەبێتەوە گەر زانی خوێنی ســووڕی مانگانە نییە : ئەوە بە خوێن چڕکەی هەژمار دەکات (لە شوێنی خۆی باسی دەکەین).

تەنها شوێنەکەی دەشوات و پاکی دەکاتەوە و نوێژ و ڕۆژوو و سەرجێی خۆی دەکات.



## ئەو كارانەی ڕێگە پێنەدراو و حەرامن لەسەر ئافرەتێك كە خوێنی سووڕی مانگانەی بینی بێت بیكات.

**یەكەم:- نوێژ.**

عن معاذة قالت : سألت عائشة رضي الله عنها فقلتُ ما بال الحائض تقضي الصوم ولا الصلاة ؟( فقالت : أحرورية أنتِ ؟ لكني أسأل ، قالت : كان يصيبنا ذلك ، فنؤمر بقضاء الصوم ولا نؤمر بضاء الصلاة ).[١٢]

واتە : موعاذة خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێ : لە عائیشەم پرسی ڕەزای خوا لێبێت ووتم : بۆچی ئافرەتی كە لە سووڕی مانگانەدایە ڕۆژوو دەگرێتەوە و بەڵام نوێژ ناگێڕێتەوە دایكی خۆشەویستم عائیشە فەرمووی : تۆ حەروری ( شوێنێ بوو خەوارجی ئەو كاتە تێیدا كۆدەبوونەوە ) ووتم : من حەروری نیم بەڵام پرسیار دەكەم . خاتوو عائیشە ڕەزای خوای لێبێ فەرمووی : ئێمە تووشی سووڕی مانگانە دەبووین جا فەرمانمان پێ دەكرا كە ڕۆژوو بگرینەوە، وە فەرمانمان پێنەدەكرا كە نوێژ بگێڕینەوە.

هەروەها پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێ : (دعي الصلاة قدر الايام التي كنت تحيضين فيها ، ثم اغتسلي وصلي).[١٣]

---

١٢- البخاري : ٣٢١ . المسلم : ٢٦٥.

١٣- متفق عليه.

واتە : بە ئەندازەی ئەو ڕۆژانەی دەکەویتە سووڕی مانگانەوە واز لە نوێژ بێنە و مەیکە (جا ماوەکەی چەندێک بێت لە ئافرەتێکەوە بۆ ئافرەتێکی تر دەگۆڕێت)، پاشان خۆت بشۆ و نوێژ بکە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ( إذا أقبلت الحيضة فدعي الصلاة ).[١٤]

واتە : ئەگەر سووڕی مانگانە هات واز لە نوێژ بێنە و مەیکە.

**چەند ڕوونکردنەوەیەک:-**

ئەگەر ئافرەتێك لە سووڕی مانگانە پاك بوویەوە لە كاتی نوێژێك لە نوێژەکان، ئەوە فەرزە لەسەری ئەو نوێژەی لە کاتەکەیدا پاك بووەتەوە ئەنجامی بدات، بۆ نموونە: ئافرەتێك لە دوای نوێژی بەیانی پێش خۆر هەڵاتن بە نیو سەعاتێك پاك دەبێتەوە، کە دەتوانێ بە ئاسانی خۆی بشوات؛ بە بۆچوونی هەموو شەرع ناسان لەسەری فەرزە نوێژی بەیانی بکات، هەروەها بۆ نوێژەکانی تریش بەهەمان شێوەیە، گومان نییە لەسەر فەرزییەتی ئەم نوێژە لەسەری.

ئەی ئەگەر بۆ نموونە؛ کاتی نوێژی بەیانی پاك بوویەوە، بەڵام یەك تۆز پێش خۆر هەڵاتن، بەڕادەیەك ناگاتە خۆشۆردن و نوێژ کردن ، بەبێ ئەوەی کەمتەرخەمی بکات ، جا شەرع ناسان لەمەدا دەبنە دوو بەشەوە.

١٤- البخاري : ٣١٠.

**١-** دەفەرموون: ئەنجامدان و گێڕانەوەی ئەو نوێژەی لەسەر نییە، و نوێژی بەبێ دەست نوێژ دروست نییە و کاتی نوێژیش دیاریکراوە کەواتە مادام وایە ئەو نوێژەی لەسەر نییە ، ئەمەش ڕای امام مالك و ئەوزاعی و هەندێك لە شافعییەکانە ، لەڕاستیدا ئەم ووتەیە ووتەیەکی بێ هێز و لاوازە.

**٢-** کە ئەمە بۆچوونە ڕاست و دروست و تەواوەکەیە بەڵگەکانیش شایەتن لەسەری، ئەویش ئەوەیە: گرینگ بگاتە کاتی نوێژەکە جیاوازی نییە لە نێوان کەمتەرخەمی لە خۆشۆردن تاکاتی نوێژ تەواو دەبێت یان نا. یان دەگاتە خۆشۆرن یان نا، ئەمەش ڕای امام احمد و حەسەنی بەسرِی و حەمماد و ثەوری و قەتادە و هەندێك لە شافعییەکانە.[١٥]

چونکە گەیشتۆتە کاتی نوێژەکە ، نوێژ لەسەر فەرز دەبێ و خۆشۆردن لەسەری واجب دەبێ ، هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: (مَن أدْرك ركعةً من الصَّلاةِ، فقد أدْركَ الصَّلاة).[١٦]

واتە : هەر کەس بگاتە ڕکاتێکی نوێژی عسر پێش خۆرئاوا بوون ئەوا گەیشتۆتە نوێژەکە.

---

١٥- (المجموع) للنووي (٣/٦٦) ، ( المغني) لابن قدامة (١/٢٨٧).

١٦- رواه البخاري (٥٨٠) واللفظ له ، ومسلم (٦٠٧).

**پـــرســـیار**/ گەر ئافرەتێك لە پێش عەسر پاك بووەوە نوێژی نیوەڕۆی نەكردووە، بەڵام تا خۆی شـوۆرد نوێژی عەسـری بەسـەردا هات، ئایە نوێژی نیوەڕۆكەی قەرزارە؟.

**وەڵام/** بەڵێ: گەر پێش خۆر ئاوا بوون لە سـوورِی مانگانە پاك بوویەوە دەبێـت نـوێژی عەسـر و نیـوەڕۆ بکـات (چـونکە هەمـان حـوکمی سـەفەر وەردەگرێ)، وە ئەگەر پێش خۆر هەڵاتن پاكبووە دەبێ نوێژی مەغریب و عیشا بكات.

**پرسیار/** حوكمی ئەو ئافرەتە چییە كە نوێژی نەكردبوو، دواتر دەكەوێتە نێو حەیزەوە؟.

**وەڵام**/ دوای ئەوەی لە حەیز پاك دەبێتەوە نوێژەكە قەزا دەكاتەوە، جا ماوەكەی هەر چەندێك بێت.[١٧]

## دووەم:- ڕۆژوو.

بە هەمان شـێوە فەرموودەكەی دایكمان عائیشـەتان بیردەخەمەوە كە بە موعاذەی ووت : ( كان يصـيبنا ذلك ، فنؤمر بقضـاء الصـوم ، ولا نؤمر بقضاء الصلاة ).[١٨]

---

١٧- فتاوى مختصرة لشيخ محمد بن صالح العثيمين.

١٨- البخاري : ٣٢١ . المسلم : ٢٦٥.

واتە : ئێمە تووشی سووڕی مانگانە دەبووین جا فەرمانمان پێ دەکرا کە ڕۆژوو بگرینەوە، وە فەرمانمان پێنەدەکرا کە نوێژ بگێڕینەوە.

کەواتە ئافرەت لە سـووڕی مانگانەدا ڕۆژوو ناگرێ، دوای ڕەمەزان کە پاك بوویەوە دەیانگرێتەوە.

**ڕای زانایان لەسەر ڕۆژووی ئافرەتێك لە سووڕی مانگانەدا بێت:-**

**١-** ئیمامی شـەوکانی رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرمووێ: **(والحديثُ يدُلُّ على عَدَمِ وُجوبِ الصَّومِ والصَّلاةِ على الحائِضِ حال حيضِها، وهو إجماعٌ )**.[19]

واتە : ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسـەر واجب نەبوونی نوێژ و ڕۆژوو لەسـەر ئافرەتێك لە سـووڕی مانگانەدا بێت لە کاتی سـووڕی مانگانەیدا، ئەمەش کۆدەنگی شەرع ناسانی لەسەرە.

**٢-** ئیمـامی النووی رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرمووێ : **(أجمع المسـلمونَ على أنَّ الحائِضَ والنُّفَساءَ لا تجب عليهما الصَّلاةُ ولا الصَّومُ في الحال)**.[20]

واتە : موسـڵمانان لەسـەر ئەمە یەکدەنگن کە ئافرەتێك لە سـووڕی مانگانە و زەیستانی بێت ئەوە نوێژ و ڕۆژوو لەسەر هەردووکیان واجب نییە.

---

١٩- نیل الأوطار: (٢/٢٨٠).

٢٠- شرح النووي على مسلم (٤/٢٦).

**٣-** ئیمامی ابن حزم رَحِمَهُ اللَّهُ دەفەرمووێ : **(اتَّفقوا على أنَّ صِـيامَ نَهارِ رَمضـانَ على الصَّحيحِ المُقيم العاقِلِ البالِغِ الذي يعلم أنَّه رمضـان، وقد بلغه وجوبُ صيامِه، وهو مسلمٌ، وليس امرأةً حائضًا..)**.[٢١]

واتە : شەرع ناسان یەك دەنگن ڕۆژووی ڕەمەزان لەسەر دانیشتوو بێت ( لە سەفەردا نەبێ ) و ژیر بێت و باڵغ بوو بێت و وە بزانێ ئەوە مانگی ڕەمەزانە، پێی گەیشـتبێ كە بەڕۆژوو بوون واجبە، و موسـڵمان بێت، وە ڕۆژوو لەسـەر ئافرەت نییە لە سووڕی مانگانەدا بێت.

كەواتە : حەڕامە ئافرەتێك لە سووڕی مانگانەدا بێت و بەڕۆژوو یان نوێژ بكات. واللە اعلم.

**چەند ڕوونكردنەوەیەك** دەربارەی سـووڕی مانگانەی ئافرەت لە كاتی بەڕۆژوو بووندا:-

**١-** ئەگەر ئافرەت پاش نوێژی بەیانی پاك بووەوە : پێویسـت ناكات ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو بێـت، لەبەر ئەوەی دروسـت نییە ئە ڕۆژە بەڕۆژوو بێـت كە سـەرەتاكەی لەناو حەیزدا بووە و بە ڕۆژووگر دانانرێت، دوای پاك بوونەوەی دەیانگرێتەوە.[٢٢]

---

[٢١] المحلى (٦/١٦٠).

[٢٢] مەزهەبی امام مالك : ( الكافي ) لابن عبدالبر (١/٣٤٠).

**٢-** وە ئەگەر ئافرەت بە چەند خولەكێك پێش نوێژی بەیانی پاك بووەوە: ئەوە ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو دەبێت، هەرچەندە لە دوای نوێژەوە خۆشۆردن ئەنجام بدات، چونكە خۆشـۆردن پێوەر و مەرج نییە بۆ ڕۆژوو ، تەنها پێویستە نییەت بە دڵ بێنێت بۆ ڕۆژووەكەی.[٢٣]

**٣-** وە ئەگەر ئافرەت دوای خۆرئاوا بوون خوێنی سووڕی مانگانەی بینی: ئەوە ڕۆژووەكەی دروستە و پێویست ناكات ڕۆژووەكەی بگێڕێتەوە، هەرچەندە پێش خۆرئاوا بوون هەسـت بە خوێنی سـووڕی مانگانە بكات، ئەوەی ڕۆژوو بەتاڵ دەكاتەوە بینینی خوێنی سووڕی مانگانەیە نەوەك ئازارەكەی.[٢٤]

**٤-** ئەگەر ئافرەت پێش خۆرئاوابوون پاك بووەوە یان تووشـی سـووڕی مانگانە بوو: ئەوە بەڕۆژوو نەبووە و ڕۆژووەكەی دەگێڕێتەوە، ئەگەر بە چەند خولەكێك بێت.[٢٥]

## سێیەم:- خوێندن و دەست لێدانی قوڕئان.

ئیمامی خۆشـەویسـتم ئیمام ابن تیمیة رَحِمَهُ اللَّهُ دەفەرمووێ : ئافرەتان لەسـەردەمی پـێغەمبەری خـوادا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەكەوتنە نـاو سـووڕی مانگانەوە، هیچ كەسـێك قەدەغەی خوێندنی قوڕئانی لێنەدەكردن، گەر بۆ

---

٢٣- مەزهەبی امام شافعی :( المجموع ) للنووي (٦/٢٧٥).

٢٤- ڕیوایەتێك لە امام احمد : ( الشرح الكبیر ) لابن قدامة (٦٢/٣).

٢٥- وە هەڵبژاردەی ابن حزمە : ( المحلى : ٢٤١/٦).

ئافرەت قەدەغە بێت ئەوە فەرموودەی ڕاســـت و دروســـتمان بەدەســـت دەگەیشت دەربارەی قەدەغەکردنی، وەکو چۆن هاتووە لە قەدەغەکردنی نوێژ و ڕۆژوو، هەرچی ئەو فەرموودانەی هاتوون دەربارەی بە بەڵگە دانانرێت، زانراوە شەرع هەرگیز ڕێگری لەمە ناکات.[٢٦]

ئەم زانا بەڕێزانەش بە هەمان شێوە ڕێگایان بەمە داوە.[٢٧]

**دەست لێدانی قورئان لای ئافرەتێك لە سووڕی مانگانەدا بێت.**

خوای پەروەردگار دەفەرمووێ : ﴿إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ ٧٧ فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ٧٨ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ٧٩﴾(الواقعة: ٧٧-٧٩).

واتە : بەڕاســـتی ئەوەی کە محمد ﷺ دەیخوێنێتەوە قورئانێکە زۆر پیرۆزو بەڕێزە . لە کتێبێکی شـــاراوەدا کە لوح المحفوظ ـــــە، پارێزراوە. تەنها پاکان نەبێت کەس دەستی لێ نادات.

---

٢٦- (مجموع الفتاوى) لابن تيمية (٤٦٠/٢١).

٢٧- مەزهەبی امام مالك (الذخيرة)لابن جزي (ص: ٢٥).

والظاهريَّة : ( المحلى ) لابن حزم (٩٤/١).

ووتەیەکی امام شافعی : ( الطالبين ) للنووي (٨٦/١).

ڕیوایەتێکی امام احمد : ( الاختيارات الفقهية ) لابن تيمية (ص: ٢٧).

هەڵبژاردەدەی امامی تەبەڕی : ( شرح صحيح .البخاري ) لابن بطال (٤٢٣/١، ٤٢٤).

وە هەڵبژاردەی امامی ابن القيم : ( أعلام الموقعين عن رب العالمين ) (٢٥/٣).

زانایان ئەم ئایەتە بە بەڵگە دادەنێن کە ئافرەتێ لە سووڕی مانگانەدا بێت بۆی ڕەوا نییە دەست لە قوڕئان بدات.

پێغەمبەری ﷺ دەفەرمووێ : (لا يَمسَّ القرآنَ إلَّا طاهرٌ).[٢٨]

واتە: نابێت کەس دەست لە قوڕئان بدات تەنها ئەوەی پاك نەبێت.

هەروەها هەر چوار مەزهەبەکە لەسەر ئەمە کۆ دەنگن کە بۆ ئافرەتێك لە سووڕی مانگانەدا بێت بۆ ڕەوا نییە دەست لە قوڕئان بدات.[٢٩]

**پرسیار/** تا چەند ئەو حدیثە صحیحە کە دەڵێ: (لیس الحیض فی ید)؟ گەر صحیحە ئەمە نابێتە دلیل لەسەر ئەوەی کە سووڕی مانگانە لە دەست نییە بەو شیوە دەتوانین دەست لە قورئان بدەین؟.

**وەڵام/** ئەو فەرموودەی بەڕێزتان ناردتان بەم لە فەزەدا نەهاتووە لە سوونەتدا بەڵکو لەفزە ڕاست و دروستەکەی بەم جۆرەیە : (ناوليني الخمرة من المسجد قالت قلت إني حائض قال : إن حيضتك ليست في يدك).[٣٠]

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەتا بوو بانگی دایکمان عائیشەی کرد تاوەکو بەرماڵی نوێژ کردنی بۆ بێنێ ، پاشان دایکمان فەرمووی من لە سووڕی

٢٨- صحَّحه الألباني في (صحيح الجامع).

٢٩- حەنەفییەکان : ( فتح القدير ) للكمال ابن الهمام (١٦٨/١-١٦٩).

مالیکییەکان : ( منح الجليل ) لعليش (١٧٥/١).

شافیعییەکان : ( الأم ) للشافعي (٨٠/١).

حەنابیلەکان : ( شرح منتهى الإرادات ) للبهوتي (١١١/١).

٣٠- رواه مسلم: ٥٤٩

مانگانەدام ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : گەر لە سووڕی مانگانە بووی ئەوە دەستت لە سووڕی مانگانەدا نییە.

بۆیە ئەم فەرموودەیە پەیوەندی بە دەست لێدان لە قورئانەکەی خوای پەروەردگارەوە نییە، بەڵکو قسەی دایکمانە.

مەبەستم لەمەیە ئایە دەتوانم بێمە مزگەوتەوە لە کاتێکا لە سووڕی مانگانەدام ؟!.

پێغەمبەری خوا ﷺ فێرمان دەکات کە بەڵێ دەتوانی گەر لە سووڕی مانگانەشدا بیت ، چونکە لاشەی ئافرەت پیس نابێت لە کاتی سووڕی مانگانە تاوەکو قەدەغەی چوونە مزگەوت بکات.

بەڵگە لەم فەرموودەیە ئەوەیە ئافرەت لە سووڕی مانگانە و زەیستانی دابێت دەتوانێ بەناو مزگەوتدا تێپەڕ ببێت.[٣١]

## چوارەم :- سەرجێی کردن.

خوای پەروەردگار دەفەرمووێ : ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ۖ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ۖ﴾ (البقرة: ٢٢٢).

---

[٣١]- وەکی ابن کثیر رحمه الله دەفەرمووێ: وفيـه دلالة على جواز مرور الحائـض في المسجد والنفساء في معناها . تفسير ابن كثير ١ / ٥٠٢.

واتە : ئەی پێغەمبەر ﷺ پرسیارت لێدەکەن دەربارەی ( سووڕی مانگانەی ئافرەت ) پێیان بڵێ : ئەوە ئازار و زەرەرە خۆتان بە دوور بگرن لە هاوسەرەکانتان کە لەو حاڵەتەدا بن و نزیکیان مەکەون تا پاک دەبنەوە، جا کاتێک پاک و خاوێن بوونەوە و خۆیان شۆری بچنە لایان ، بەو شێوەیەی کە خوا فەرمانی داوە، بەڕاستی خوا تەوبەکاران و پاکانی خۆشدەوێت.

ئیمامی النووی رَحِمَهُ اللَّهُ دەفەرمووێ : **(أجمع المسلمون على تحريمِ وَطءِ الحائض)**.[٣٢]

واتە : کۆ دەنگی موسڵمانان لەسەر حەڕامیەتی سەرجێیە لەگەڵ ئافرەتێك لە سووڕی مانگانەدا بێت.

هەروەها ئیمامی ابن تیمیە رَحِمَهُ اللَّهُ دەفەرمووێ : **(وطءُ الحائِضِ لا يجوز، باتِّفاق الأئمَّة)**.[٣٣]

واتە : سەرجێیکردن لەگەڵ ئافرەتێك لە سووڕی مانگانەدا بێت ڕێگە پێنەدراوە، بەڕێکەوتنی پێشەوا بەرزەکان.

چێژوەرگرتن لە کاتی سووڕی مانگانەدا: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ( اصنَعوا كلَّ شيءٍ إلَّا النِّكاحَ ).[٣٤]

---

٣٢- (المجموع) (٢/٣٥٩).

٣٣- (مجموع الفتاوى) (٢١/٦٢٤).

٣٤- رواه مسلم (٣٠٢).

واتە : دەتوانن هەموو كارێك بكەن تەنها سەرجێی نەبێت.

وەك پێچەوانەیەك لەگەڵ جوولەكەكان كە ئەوان لەماڵیش نامێننەووە.

ئیمامی ابن القدامه دەفەرمووێ : **( الاستمتاعُ من الحائض فيما فوق السُّرَّة ودون الرُّكبةِ ؛ جائز بالنصِّ والإجماعِ، والوطءُ في الفَرجِ محرَّمٌ بهما ).**[35]

واتە : چێژ وەرگرتن لە ئافرەتێ لە سووڕی مانگانەدایە لە سەرووی ناوكییەوە و لە ژێر ئەژنۆیەوە ڕێگە پێدراوە بە بەڵگەی قورئان و سوونەت و كۆ دەنگی زانایان، وە سورجێی لە دامێنەووە قەدەغەكراوە بە بەڵگەی قورئان و سونەت و كۆدەنگی زانایان.

قەدەغەیە سەرجێی لە دامێنەوە تا ئافرەتەكە خۆی دەشۆرێ : هەروەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ۖ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ۖ ﴾ (البقرة: ٢٢٢).

واتە : ئەی پێغەمبەر ﷺ پرسیارت لێدەكەن دەربارەی ( سووڕی مانگانەی ئافرەت ) پێیان بڵێ : ئەوە ئازار و زەرەرە خۆتان بە دوور بگرن لە هاوسەرەكانتان كە لەو حاڵەتەدا بن و نزیكیان مەكەون تا پاك دەبنەوە ، جاكاتێک پاك و خاوێن بوونەوە و خۆیان شۆری بچنە لایان ، بەو شێوەیەی

---

٣٥- ( المغني ) (١/٢٤٢).

کە خوا فەرمانی داوە، بەڕاستی خوا تەوبەکاران و پاکانی خۆشدەوێت. (تَطَهَّرْنَ ): اغتسلْنَ.[٣٦]

ئیمامی تەبەڕی دەفەرمووێ مەبەست لە پاك بوونەوە : خۆشۆردنیانە.

ابن قدامه لە أحمد المَرُّوذيِّ نەقلی کردووە کە فەرموویەتی: **(لا أعلم في هذا خلافًا)**.[٣٧]

(يقصد تحريمَ وطء الحائض قبل الغُسل) . واتە : وامنەزانیوە ڕاجیاوازی لەسەر ئەمەدا هەبێت .ابن قدامه دەفەرمووێ : مەبەستی ئیمام حەڕامیەتی سەرجێی کردنی ئافرەتە لە سووڕی مانگانەدا لە دامێنەوە پێش خۆشۆردن.

## پێنجەم:- مانەوە و ئیعتیکاف کرد لە مزگەوت.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئافرەتێك لە سووڕی مانگانەدایە دەفەرمووێ : (فإني لا أُحلُّ المسجدَ لحائضٍ ولا جنُبٍ).[٣٨]

واتە : مزگەوت بۆ ئەوانەی لە جەنابەتدان و ئەوانەی لە سووڕی مانگانەدان ڕێگەپێدراو نییە .

---

٣٦- ( تفسير الطبري ) (٣٨٧/٤).

٣٧- ((المغني)) (٢٤٥/١)

٣٨- (أبو داود : ٢٣٢ ، وابن خزيمة : ١٣٢٧ والبيهقي : ٤٤٩٥).

مانەوە لە مزگەوت و ئیعتکاف کردن بۆ غەیری پێویستی ڕێگە پێدراو نییە بۆ ئافرەتێك لە سووڕی مانگانەدایە تاوەکو پاك دەبێتەوە و پاشان خۆی دەشۆرێ، ئینجا بۆی هەیە لە مزگەوت بمێنێتەوە و ئیعتکاف بکات، ئەمەش بە کۆ دەنگی هەر چوار شەرع ناسە بەڕێزکەی ئوومەت ڕێگە پێدراو نییە. [٣٩]

**شەشەم:- تەوافی بەیت.**

لە ابن عباس دەگێڕنەوە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا کە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێ: (الطَّوافُ حَولَ البيتِ مِثلُ الصَّلاةِ، إلَّا أنَّكم تتكلَّمونَ فيه، فمن تكلَّمَ فيه فلا يتكلَّمنَّ إلَّا بخيرٍ).[٤٠]

واتە : تەوافی بەیت وەك نوێژ وایە، تەنها جیاوازی ئەوە هەیە دەتوانن قسە بکەن، ئەوەی قسەش دەکات با تەنها خێر بلێت.

وە دایکمان عائیشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا لە کاتی حەجدا کەوتەوە سووڕی مانگانەوە، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێی فەرمووە: (افعلي ما يفعَلُ الحاجُّ، غيرَ أن لا تطوفِي بالبيتِ حتى تطهُري).[٤١]

---

[٣٩] حەنەفییەکان : (البحر الرائق) لابن نجيم (٣٢٢/٢).
مالیکییەکان : : (القوانين الفقهية) لابن جزي (ص٣١).
شافیعییەکان : ( المجموع ) للنووي (٥٤٩/٦).
حەنبەلییەکان : ( مجموع الفتاوى ) لابن تيمية (٢٧٥/٢١).
[٤٠] وصححه الألباني في (صحيح سنن الترمذي) : ٩٦٠.
[٤١] رواه مسلم (١٢١١).

واتە : هەرچی حـاجی دەیکـات تۆش بیکە بەڵام تەواف مەکە تـا پـاك دەبیتەووە .

**پاك بوونەوە:** واتا تا خۆت دەشۆی تەواف مەكە .

ئیمـامی النووی رَحِمَهُ اللهُ کۆ دەنگی زانـایـان دەهێنێتەوە و دەفەرمووێ : **(الطَّواف لا يصح مِنَ الحائض، وهذا مجمَعٌ عليه )**.[٤٢]

واتە : تەواف دروســـت نییە ئـافرەتێ لە ســـوورِی مانگانەدا بێـت، کە ئەمەش کۆ دەنگی شـەرع ناسانی لەسـەرە.



٤٢- (شرح النووي على مسلم) (١٤٧/٨).

## ئەو كارانەی بۆ ئافرەتێك ڕێگەپێدراوە كە لە سووڕی مانگانەدا بێت

**١-** ام ســلمه رَضِيَ اللهُ عَنْهَا دەفەرمووێ : (بيْنَا أنَا مع النبيّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُضْطَجِعَةٌ في خَمِيصَةٍ إذْ حِضْتُ فَانْسَلَلْتُ فأخَذْتُ ثِيَاب حِيضَتِي ، قالَ: أنُفِسْتِ قُلتُ: نَعَمْ، فَدَعَانِي، فَاضْطَجَعْتُ معهُ في الخَمِيلَةِ ).[٤٣]

واتە : لەو كاتەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا لە ژێر جاجمێكی خوری ڕەشدا پاڵكەوتبووم، كەوتمە سووڕی مانگانەوە، بە هێواشی لە ژێر جاجمكە هاتمە دەرەوە و جل و بەرگەكانی تایبەت بە كاتی سووڕی مانگانەی خۆم كۆكردەوە، پێغەمبەری خوا پرسی : كەوتیتە سووڕی مانگانەوە؟ ووتم : بەڵێ، بانگی كردمەوە ئیتر چوومەوە ژێر جێگاكەمەوە .

**٢-** دایكمان عائیشە رَضِيَ اللهُ عَنْهَا دەفەرمووێ : ( كُنْتُ أُرَجِّلُ رَأْسَ رَسولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وأَنَا حَائِضٌ ).[٤٤]

واتە : لەو كاتەی لە سووڕی مانگانەدا بووم سەری پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شانە دەكرد.

---

٤٣- البخاري : ٢٩٨.

٤٤- البخاري : ٢٩٥.

**ڕوونکردنەوە:** کار و بارەی هاوسەر و ماڵەوە گشتی ڕێگە پێدراوە.

**٣-** هەر دایکمان عائیشە رضي الله عنها دەفەرمووێ : (كـان النبيُّ صلى الله عليه وسلم يَقْرَأُ القُرْآنَ ورَأْسُهُ في حَجْرِي وأنا حائِضٌ ).[٤٥]

واتە : پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەری لەسەر کۆشم بوو، قورئانی دەخوێند منیش لە سووڕی مانگانەدا بووم.

هەروەها **چەند ڕوونکردنەوەیەک:** زیکر و تەسبیح سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگار و گوێ گرتن لە قورئان و گوێ گرتن لە ووتار و بەشدار کردن لە کۆڕی زانستی شەرعی بۆ ئافرەت ڕێگە پێدراون، وە بانگەوازی کردن و فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە، وانە ووتنەوە و خوێندنی فەرموودە بۆ ئافرەتێك لە سووڕی مانگانەدایە ڕێگە پێدراوە.[٤٦]

**پرسیار ١/** ئایە شوێنی مەنی و یان شوێنی خوێن لە سوڕی مانگانە دەشۆردرێ؟.

**وەڵام/** مەنی پیس نیە, چونکە سەنەد لە هیچ کەسێکەوە نەهاتووە کە بەڵگەبێت بۆ ئەوەی کە فەرمان بە موسڵمانان کرابێت بەشۆردنی جەستەیان

---

٤٥- البخاري : ٧٥٤٩.

٤٦- ابن باز ( نور على الدرب ).

و جلەکانیان لە مەنی، بەشـێوەیەکی گشـتی ئەو ڕوودانە، بەڵکو فەرمان کراوە بەوەی کە ئافرەتی لەش گران جلەکانی بشـوات گەر خوێنی سـوڕی مانگانەی پێوە بوو لەگەڵ ئەوەش زۆر پێویست بەمە ناکات، وە فەرمانی بە موسڵمانان نەکردووە کە جەستە و جلەکانیان بشۆرن بەهۆی مەنی یەوە.

وە ئەو فەرموودەیەی کە هەندێك لە شـەرعزانان ئەیگێڕنەوە: (یغسـل الثوب من البول والغائط والمني والمذي والدم).

واتە: جل ئەشـۆردرێت گەر میز و پیسـایی و مەنی و مەزی و خوێنی پێوە بوو، ئەمە قسـەی رسـول الله نیە ﷺ، وە لە هیچ کتێبێکی پشـت پێبەسـتراوی فـەرموودە نـەهـاتووە، وە هیچ کـەسـێك لـە ئـەهلی عیلم دەقی فـەرموودەکـەی ڕیوایـەت نـەکردووە بە سـەنەدێك کە بکرێتە بەڵگە، وە لە عمارەوە گێڕدراوەتەوە و دەکرێ قسەی ئەو بێت.

وە ئەوەی کە دایکە عـائشـە جلەکەی شـۆرد کە مەنی پێوە بوو وە پرواندی، بەڵگە نیە لەسـەر واجب بوونی شـۆردنی، چونکە جل گەر پیسـی و چڵم و تفیشی پێوە بێت هەر دەشۆردرێت، وە واجب بوون بە فەرمانکردنە، وە رسـول الله ﷺ فەرمانی نەکردووە بە شـۆردنی جلەکانیان گەر مەنی پێوە بوو، وە ڕیوایەت نەکراوە کە فەرمانی بە دایکە عائشـە کردبێت کە ئەو کارە بکات، بەڵکو اقراری کردووە، ئەمەش بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی کە

دەکرێت بشـۆردرێت, یان باشـە یان حەزپێکراوە. بەڵام بۆ واجب بوون ئەبێت بەڵگە هەبێت.

**پرسـیار٢/** ئافرەت لەکاتی سـوڕی مانگانەی تەواو ئەبێت ئەو ڕۆژەی کە خۆی ئەشـوات دروسـتە بەڕۆژو بیـت؟ بۆ پێش بـانگی بەیـانی تەواو پـاك دەبێتەوە؟.

**وەڵام/** بەڵێ حیسابی مانگەکانی پێشـووی بۆ دەکەن گەر وەك مانگەکانی پێشوو نەبوو چاوەڕێ دەکەن تاوەکو پاك دەبنەوە.

وە لە دوای پاك بوونەوە نیشـانە هەن لەوانە : ئاوی سـپی یان ئاویکی لێڵە یان زەردە یان دڵۆپە خوێنێکە.

جا گەر ئەم پاك بوونەوەیەتان پێش بانگی بەیانی بوو یان لەگەڵ بانگی بەیانی بوو ئەوە نیەتی ڕۆژوو دەهێنی و بەڕۆژوو دەبیت، وە ئاسـاییە گەر دوای بانگ غوسـلەکە ئەنجام بدرێ بۆ نوێژ.بەڵام واباشـە کە پەلە نەکەن لە پاك بوونەوە تاوەکو تەواو دڵنیا دەبنەوە. والله اعلم.

**پرسـیار٣/** ئافرەتێکی دوو گیان کە شـتێکی بینیوە هاوشـێوەی سـووڕی مانگانە، وە خوێنی لێ دەڕوات بەردەوام، وە مامانەکە ووتی کەوا ئافرەت بە

ڕۆژوو نابێت لە پێناو بەرژەوەندی کۆرپەلەکەی، وە ئافرەتەکە هیچ ئازارێکیشی نەبوو، ئایا درووستە بۆی کە بە ڕۆژوو نەبێت؟ یان نا؟.

**وەڵام/** ئیمامی ابن تیمیە دەفەرمووێ:**(ئەگەر ئافرەتی دوو گیان ترسی هەبوو بۆ کۆرپەلەکەی، ئەوا بە ڕۆژوو نابێت، لەبری هەر ڕۆژێك ڕۆژوویەك دەگرێتەوە، وە لەبری هەر ڕۆژێك خواردنی هەژارێک دەدات، کە خواردنەکە دەبێت یەك ڕەتڵ (٤٥٣گم) بێت لە خواردنی ڕۆژانەی خۆی).**

**پرسیار٤/** کەسێك طالب العلم بیت و بێگومان لە مصحف خۆی دەخوێنێ، چۆن بخوێنێ لە کاتی سوڕی مانگانە؟.

**وەڵام/** بێگومان باشترین کات لە دوای قیام اللیل بۆ ئافرەتان بۆ مڕاجعەی لەبەرکرد و خوێندنەوەی خۆی لە کاتی سووڕی مانگانەیەتی، کە کاتێکە زۆر پێویستە خوشکانمان استغلالی بکەن و بە فیڕۆی نەدەن ، وە ئارامی و سکینەت دادەبەزێتە سەر دڵیان لەم کاتانەدا کە لە سووڕی مانگانەدان...

بۆ دەست لێدان وەك پێشوو باسمان کردووە کە حەرامە ڕاستەوخۆ دەست لە قورئان بدرێ بە دەستی ڕووت و ڕاستەوخۆوە، بۆ ئەوەی بتوانی

قورئان بخوێنی و مراجعەی بکەنەوە پێویستە بە دەستکێشەوە دەست لە قورئانەکە بدرێت، کە زانایان باسیان لێوە کردووە. **والله اعلم**.

**پرسیار ٥/** ئایە ڕەوایە حەبی دواخستنی سووڕی مانگانە بەکاربهێنرێ لە پێناوی بەڕۆژووبونی مانگی ڕەمەزان و بێبەش نەبوون لە خێری مانگی ڕەمەزان؟.

**وەڵام/** نەخێری شەرعزانان بە حەرامیان داناوە ئافرەت سووڕی مانگانەی خۆی دوابخات بەهۆی حەبەوە بێت یاخود بەهۆی هەر شتێکی ترەوە، بەڵام باشترە بەکارنەهێنرێت چونکە زیان بە لاشە و دەروونی ئافرەتەکە دەگەیانی وەکو زانایانی پزیشکی باسیان لێوە کردووە.

**پرسیار ٦/** من ڕۆژی پێنج شەممەی ڕابردوو پێش بانگ نیوەڕۆ کەوتمە سووڕی مانگانەوە، واتە رۆژیک پیش رەمەزان. هەتا دوێنی پینج شەممە خوێنم نەمابوو، بەلام ئاوی قاوەییم هەبوو خۆم شۆرد، بەلام نە ڕۆژووم گرت نە نوێژم کرد، هەتا ئەمشەو سەعات یەک هەر کەم کەم ئەو ئاوە قاوەییە مابوو، بەلام لە پاش سەعات یەک هیچ ئاو و شت نەما، منیش پارشیوم کرد، بەلام سەیرم کرد ئاویکی سپی لیل بوو قاوەیی نەبوو زۆریش کەم بوو، ئیستا رۆژووم گرتووە ئایا ڕۆژوەکەم دروستە یان نا؟ من خۆم سووڕی مانگانەم حەوت ڕۆژە، ڕۆژی هەشتەم خاوێنم،بەتەواوی!.




**وەڵام/** بەڵێ ڕۆژووەکەت تەواو بکە چونکە نیشـــانەی پاك بوونەوەت تیا بەدەرکەوتووە ئەویش ئەو ئاوە سـپی ڵێڵەیە کە بینیووتانە، خوای پەروەردگار لێتانی قبوڵ بکات.

**ڕوونکردنەوەیەک:** وەك ووتمان بینینی ئاوی قاوەیی مانای بەرەو کۆتایی بوونی ماوەی ســووڕی مانگانەیە لە ئافرەتان جا تا ئەم ئاوە قاوەییە نامێنێ غوسل ناکرێ و دەست بە نوێژ و ڕۆژوو و سەرجێی ناکرێتەوە.**والله اعلم**.



# خوێنی منداڵ بوون

**خوێنی منداڵ بوون له زمانهوانیدا** : من النَّفْس، ومن معاني النَّفْس: الدَّم.

واته : به مانای خوێن دێت. [٤٧]

هەروەها به ( **النُّفَساء** ) ناودەبردرێت : بەهۆی دەرچوونی خوێن. [٤٨]

**یان :** بەهۆکاری دەرچوونی ئازارەوەیە. [٤٩]

**له شەرعزانیدا** : (دمٌ يُرخيه الرَّحِمُ؛ بسبب قُربِ الولادةِ أو وقوعِها).

واته : ئەو خوێنەیە دەردەچێت له منداڵدانی ئافرەت ، به هۆکاری نزیك بوونەوە کاتی منداڵ بوون یان کەوتنە نێو منداڵبوونەوە.

**حوکمی خوێنی منداڵ بوون :** شـەرع ناسـان لەسـەر ئەمه کۆکن که حوکمی شـەرعی خوێنی منداڵ بوون وەکو حوکمی شـەرعی سـووڕی مانگانەیە، له هەرچی قەدەغه و ڕێگا پێدراو هەیە هـاوشـێوەن، وەکو ( **نوێژ و ڕۆژوو و**

---

٤٧- لسان العرب : لابن منظور (٦/٢٣٨).

٤٨- مقاييس اللغة : لابن فارس (٥/٤٦٠).

٤٩- (شرح منتهى الإرادات: للبهوتي (١/١٢٢) .

**قورئان خوێندن و هەڵگرتنی و تەوافی بەیت و مانەوە لە مزگەوت و ســەرجێی کردن )** ، وەکو چۆن ئەمانە لە سووڕی مانگانە قەدەغەن بە هەمان شێوە لە کاتی بینینی خوێنی منـداڵ بوون قەدەغەن، جگە لەمـانە لە کـار و بـار و پێویستییەکان حەڵاڵ و ڕێگە پێدراون.

**کەمتـــرین و درێـــژترین ماوەی نیفاس:** دایکی ئیمانداران ئوم سـلمە رَضِيَ اللهُ عَنْهَا دەفەرمووێ: ( كـانَـتِ الـنُّـفَـســاءُ تجلِسُ على عَـهـدِ رســولِ اللّـهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أربعينَ يومًا ).[٥٠]

واتە : ئەو ئـافرەتـانەی خوێنی منـداڵ بوونیـان دەبینی لەســەردەمی پێغەمبەری خوادا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بۆماوەی چل ڕۆژ یان چل شــەو چاوەڕێی پاك بوونەوەیان دەکرد. بە هەمان شێوەی سووڕی مانگانە کاتی دیاری کراوی نییە و دەگەڕێتەوە ســەر پاك بوونەوەی ئافرەت بە بینینی نیشـــانەکانی کە هەمان نیشـــانەی ســـووڕی مانگانەن، بەڵام زۆرترین ماوە کە ئافرەت لە نێو خوێنی منداڵ بوون خۆی دەگرێتەوە کە عیبادەتە دیاریکراوەکان ٤٠ ڕۆژە کە ئەمە زۆرترین ماوەیەتی، دەشـێ ئافرەت بە ماوەی چەند ڕۆژێك پاك بێتە، مەرج نییە وەك زۆرێك لە ئافرەتان وا تێگەیشـــتوون ئەبێ ئەم ٤٠ ڕۆژە تەواو

٥٠- أبو داود : ٣١١.

بکەن ئینجا بگەڕێنەوە سەر عیبادەت و کاری سەرجێییانەوە، کە ئەمە بیرکردنەوەیەکی هەڵەیە لە لایەن زۆرێ لە ئافرەتانەوە ڕوویداوە.

**چەند ڕوونکردنەوەیەکی** گرینگ لە بارەی خوێنی منداڵ بوونەوە.

خوێن لە دوای منداڵ لە بارچوون: ئەمە بە خوێنی منداڵ بوون بۆ ئافرەت هەژمار دەکرێ ئەگەر کۆرپە لەبارچوو بوو بە منداڵ، وە ئەگەر لەبارچوو نەبوو بوو بە منداڵ ئەوا ئەو خوێنەی کە دەردەچێت واز لە نوێژ و ڕۆژوو تەواف و ئەوانی تر ناهێنێت.[٥١]

**ئەو ئاوەی بە دوو سێ ڕۆژ پێش منداڵبوون لە منداڵدانی ئافرەت دەردەچێت چەند خاڵێک لە خۆ دەگرێت.**

**یەکەم:-** ئەگەر خوێن و ئازاری لەگەڵدا بوو بە خوێنی منداڵ بوون هەژمار دەکرێت، وە ئەگەر خوێن و ئازاری لەگەڵدا نەبوو ئەوە باش نییە، بەڵام نابێت واز لە نوێژ و ڕۆژوو ئەوانیتر بێنێت .

**دووەم:-** وە ئەگەر تەنها ئاو بوو ئەوە تەنها دەستنوێژ دەشکێنێ، وە نابێت واز لە هیچ واجیباتەکان بێنێت و بە خوێنی منداڵ بوون هەژمار ناکرێت.[٥٢]

---

٥١- فتاوی مختصر لعثیمین.

٥٢-( نور علی الدرب).

# خوێن چڕکە (خوێنی نەخۆشی)

**خوێن چڕکە پێناسەی لە زمانەوانیدا:-** (أَن يستمِرَّ بالمرأةِ خُروجُ الدَّمِ بعدَ أيَّامِ حَيضِها المعتادِ). [٥٣]

واتە : دەرچوونی خوێنە بە بەردەوامی لە دوای ڕۆژانی سووڕی مانگانەی کە باوە.

**پێناسەی لە شەرعدا:-** (سَيلان الدَّمِ في غيرِ وَقتِه من أدْنى الرَّحِمِ دونَ قَعرِه).[٥٤]

واتە : ڕۆیشتنی خوێنە جگە لە کاتی خۆی لە نزیکترین شوێنی منداڵدان نەوەك بنەوەی.

**لە سیفاتەکانی خوێن چڕکە:-** زۆربەی ڕەنگی سوورە و بۆنی تایبەتی نییە، لەسەرخۆ دێتە دەرەوە ، خوێنێکی کەمە و زۆر نییە و گەنیو نییە ، وە لە شوێنی ساردا دەبەسترێ.

---

٥٣- لسان العرب : لابن منظور (١٤٣/٧) .

٥٤- روضة الطالبين : للنووي (١٣٧/١) .

## حوكمە شەرعییەكان دەربارەی خوێن چرکە

**١-** زانایان و شەرع ناسان یەك دەنگن لەسەر خوێن چرکە كە ڕێگە لە **نوێژ و ڕۆژوو و تەوافی بەیت و قورئان خوێندن بەبێ دەستكێش و مانەوە لە مزگەوت و تەڵاق** ناگرێت جیا لە سووڕی مانگانە و خوێنی منداڵ بوون، كە ئەمەش ڕای پەسەندە وەك ئیمام ابن تیمیە رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەفەرمووێ لە ( مجموع الفتاوى ) لە ( ٢٦/٢٣٤ ).

**٢-** پێویستە بۆ هەر نوێژێك دەستنوێژی نوێی بۆ هەڵبگرێتەوە لای شەرع ناسان ، وەك لای : حەنەفییەكان و شافیعیەكان و حەنبەلییەكان .[٥٥]

**ئایا ئافرەتێک لە خوێنە چرکەدا بێت دەتوانێت لەگەڵ هاوسەرەكەی كاری سەرجێی بكات؟.**

**بۆ ئەمەش سێ كۆمەڵە ووتە هەن:-**

**كۆمەڵەی یەكەم**:- كاری سەرجێ ڕێگەپێدراوە، وەك لە ابن عباس و سعیدی كوڕی جبیر و كۆمەڵێك لە تابعین گێڕدراوەتەوە.

---

٥٥- الموسوعة الفقهية : ( ٣/٣٣٣ ) .

**كۆمەڵەی دووەم:-** كاری سەرجێی ڕێگەپێنەدراوە، وەك لە دایكمان عائیشە و لەگەڵی ابراهیم النخعي و الحكم گێڕدراوەتەوە.

**كۆمەڵەی سێیەم:-** ناچێتە لای خێزانی تەنها مەگەر كاتەكەی درێژەی كێشا لەسەر ئافرەتەكە، ئەمەش ووتەیەكی ئیمام احمدە رَحِمَهُ اللَّهُ.[٥٦]

**كۆمەڵەی چوارەم:-** خۆپاراست و پاك و خاوێنی واجبە لەسەر ئافرەتان لەم خوێنە لەوەی بەر جل و بەرگ و لاشەیان بكەوێ بەپێی توانا، خۆپارێزی لە ڕێگای كلێنس یان پەمۆیەكەوە بێت گرنگ ئەوەیە ڕەچاوی پاك و خاوێنی بكرێت، وەك لای ئەم شەرع ناسانە هاتووە.[٥٧]

**والحمدلله رب العالمين**

**وصلى الله وسلم نبينا محمد وعلى آله وصحبه اجمعين**



## مافی چاپكردن و بڵاوكردنەوەی ئەم نامیلكەیە ڕێگە پێدراوە

---

٥٦- بداية المجتهد لابن رشد : ( ٤٩/١ ) .

٥٧- حەنەفییەكان : ( فتح القدير للكمال ابن الهمام ) ( ١٨٥/١ ).

شافیعیەكان : ( المجموع للنووي ) : ( ٥٣٣/٢ ).

حەنبەلییەكان : ( الشرح الكبير لابن قدامة ) : ( ٣٥٤/١ ).

# ناوەڕۆک